

زنجیرەی پەروەدەیی نەوجەوانان

# پوختەی ئادابە ئیسلامییەکان بۆ نەوجەوانان


ئامادەکردنی
سۆران عەباس





چاپی چوارەم
٢٠١١ز-١٤٣٢ك



پێداچوونەوەی
سەربەست جەباری

زنجیرەی پەروەردەیی نەوجەوانان

(( ٣ ))

# پوختەی ئادابە ئیسلامییەکان بۆ نەوجەوانان

ئامادەکردنی

سۆران عباس

پێداچوونەوەی

سەربەست جەباری

چاپی چوارەم

١٤٣١ کۆچی - ٢٠١٠ زاینی

- ناوی نامیلکە : پوختەی ئادابە ئیسلامییەکان بۆ نەوجەوانان .
- ئامادەکردنی : سۆران عباس
- پیاچوونەوەی : سەربەست جەباری
- ساڵی : ١٤٣٢ کۆچی - ٢٠١١ زاینی
- کۆمپیوتەر : ئاسۆ عەلی
- دیزاینی بەرگ : چاپەمەنی زەمان
- نۆرەی چاپ : چاپی چوارەم
- تیراژ : ٣٠٠٠ دانە
- چاپ: چاپخانەی سیما (سلێمانی)
- ژمارە سپاردنی(١٦٢٠) ی ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

**کتێبخانەی ئاینده ٠٧٧٠٥٠١٦٦٨٠**

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده و نستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مُضل له، ومن يُضلل فلا هادي له. وأشهدُ أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ )

آل عمران: ١٠٢.

( يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً )النساء: ١.

( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً. يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً)

الأحزاب: ٧٠ـ ٧١.

أمّا بعد: فإن أصدق الحديثِ كتابُ الله، وخيرَ الهدي هدي محمد ،صلى الله عليه وسلم، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# پێشەکی

هەر کۆمەڵێك بیەوێ جارێکی تر ئایینی خوا بهێنێتەوە سەر شانۆی ژیان و گۆڕانکاری دروست بکات و بارودۆخ لە دەوروبەریدا بگۆڕێت و کاریگەری هەبێت لە ژیاندا پێویستە گرنگی یەکی زۆر بداتە پەروەردەی بنەڕەتی و نەوجەوانان. تا بگەنە ئاستێکی وەها کە بتوانن ببنە هەڵگری ئەم دینە و خۆیان وخەڵکیشی لە سەری گۆش بکەن .

ئیسلام گرنگیەکی زۆری داوەتە منداڵ و نەوجەوانان هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە بەرنامەو ئامۆژگاری تایبەتی بۆ داناوە کە چۆن پێبگات . ئەرکی مامۆستا بریتی یە لە بەرجەستە کردنی بەهاکان ودۆزینەوەی ئەو تواناو بەهرەیەکە لە منداڵدا هەیە ، تاکو لە گۆڕەپانی ژیاندا بیکاتە واقیع.

لە پەیام و شەریعەتی خوادا پەرستنەکان و ڕەوشتەکان بەرەو یەك ئامانج دەڕۆن، ڕەوشت پەیوەندیەکی توند و بەهێزی هەیە بە ڕێباز و بیروباوەری ئیسلامیەوە ، ڕەوشت لایەنێکی کرداری خواپەرستیە و ڕەنگدانەوەی ئاین و بیروباوەڕە کە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی مرۆڤدا هەیە، خەڵکی بە تەنها ناڕوانننە خواپەرستی وپەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوای گەورە ، بەڵکو ئەوەی بەلای خەڵکیەوە گرنگ و خوازراوە ئەوەیە ئەو کەسەی پابەندە بە خواپەرستیو عیبادەتەوە چەندە ڕەوشت و ئاکاری هاوسەنگەو لەگەڵ دینداریەکەیدا یەکدەگرێتەوە .

# ﴿ ئادابی دەست نوێژگرتن ﴾

١- نیەت هێنان لە دڵەوە .

٢- وتنی {بسم الله} لە سەرەتاوە .

٣- قسەنەکردن و پێنەکەنین لە کاتی دەست نوێژگرتندا .

٤- ئاوەکە بە توندی ناکێشین بە دەموو چاوماندا .

٥- زیادە ڕەوی نەکردن لە ئاو سەرفکردندا .

٦- سێ جار سێ جار شوێنی دەست نوێژەکان دەشۆرین .

٧- مەسحی سەرمان دەکەین .

٨- دەست نوێژگرتن لە شوێنی بەرز و پاك .

٩- خواردنەوەی هەندێ ئاو لە دوای دەست نوێژگرتنەکە .

١٠- سیواك کردن .

١١- ئامادە بوون بۆ دەست نوێژگرتن لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا و لە کاتی سەرماو گەرمادا .

١٢- خوێندنی نزای دوای دەست نوێژ گرتن کە بریتیە لەم دوعایە :{أَشْهَدُ أنّ لا إِلَهَ الاّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَاشْهَدُ انّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ ، اَللّهُمّ اجْعَلْنِي مِنَ التَوابِينَ واجْعَلْنِي مِنّ الْمُتَطَهِرِينَ }. واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە حەق جگە لە {الله} تاکی بێ هاوبەشە ،وە شایەتی دەدەم کە محمد {صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسلم} بەندە و نێردراوی خوایە ، خوایە بمگێڕی لەتەوبەکاران و بمگێڕی لە خۆ پاککەرەوەکان .

١٣- کردنی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەست نوێژ لە دوای دەست نوێژگرتنەکە .

# ﴿ئادابی نوێژکردن﴾

١- خۆمان جوان دەکەین پێش چوون بۆ نوێژ.

٢- زوو ئامادە دەبین بۆ جەماعەت.

٣- خوێندنی قورئان پێش بانگدان .

٤- ڕێك ڕاوەستان و پەلە نەکردن.

٥- دڵـغە لێنەدان لە نوێژەکەماندا.

٦- بیرکردنەوە لەمانای نوێژەکە .

٧- پەلە نەکردن و لە سەرخۆیی لە هەموو ڕوکنەکانی نوێژدا .

٨) بەرزکردنەوەی دەست تاوەکو نەرمایی گوێچکە لەکاتی ( ألله أكبر ) ی یەکەم دا، لەکاتی چوون بۆ رکوع و هەستانەوەی دا .

٩) لە کاتی رکوعیشدا سەر و مل و پشتمان ڕێکی یەکتر دەوەستێنین و سەیری شوێنی سەجدە دەکەین .

١٠- تازە کردنەوەی دەست نوێژ لە کاتی تەنگاویدا.

١١- پێویستە نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا جێبەجێ بکەین و دوایان نەخەین.

١٢- هەوڵ بدەین نوێژەکە لە شوێنێکی بێدەنگ و ئارامدا ئەنجام بدەین .

١٣- پێویستە نوێژە فەرزەکان بە کۆمەڵ (جماعە) لە مزگەوتدا ئەنجام بدەین.

١٤-سەیرکردنی شوێنی کڕنووش بردن{ سجدە } .

١٥- کردنی نوێژە سوننەتەکان.

١٦- خوێندنی زیکرەکانی دوای نوێژ ،وەك :

أ- (٣) جار بڵێ {أسْتَغْفِرُ الله }.لە دوای سەلامدانەوە.

ب- {أللهم أنت السلامُ ومنك السلامُ تباركتَ يـا ذا الجـلال و الاكـرام }.

واتە:خوایە تۆ سەلامی وئاشتی‌و سەلامەتی لەتۆوەوەیە،پـاکی‌و بـێ عـەیبی بۆتۆیـە ئەی خاوەن شکۆو ڕێز.

ج- خوێندنی آية الكورسى ﴿بسم الله الرحمن الرحيم ((اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَـيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي الـسَّمَوَاتِ وَمَـا فِـي الأَرْضِ مَـن ذَا الَّـذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَـاء وَسِـعَ كُرْسِـيُّهُ الـسَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَـؤُدُهُ حِفْظُهُمَـا وَهُـوَ الْعَلِـيُّ الْعَظِيمُ))﴾

د-{لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك و له الحمد وهو على كل شـيء قدير} .

واته : هیچ پەرستراوێك نـی یـە بەحـەق جگـە لـە {الله} تـاکی بـێ هاوبـەش ،موڵك و ستایش بۆ ئەوە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە .

هـ- (٣٣) جار (سبحان الله) و (٣٣) جار (الحمد لله) و (٣٣) جار (ألله أكبر)

و- خوێنـدنی سـورەتی (قـل هـو الله أحـد )و (الفلـق)و (النـاس) لـە دوای هـەموو نوێـژە فەرزەکان. هەر سورەتەی (١) جار ، وە دوای نوێژی بەیانی و مغرب (٣) جار.

س- پاشان دەپاڕێنیەوە .

# ﴿واتاکانی نوێژ﴾

بۆ ئەوەی لە نوێژەکانماندا مل کەچ بین و دڵمان لای بێت پێویستە واتاکەی بزانین لەبەر ئەوەی یەکێکە لەو هۆکارانەی کە وات لێ دەکات بیر لە ماناکەی بکەیتەوە . خەیاڵت نەڕوات بۆ لای هیچ شتێکی تر کاتێك ئێمە نوێژ دەکەین ئەبێت بە شێوەیەك بێت ووشە بە ووشە دڵ و دەرونمان لای واتاکەی بێت، وە لە سەر خۆ بیڵێین ، ئەبێت وەها نوێژ بکەیت کە خوا ئەمانبینێت ئەگەر ئێمە ئەو نابینین ئەو ئێمە دەبینێت.

هەندێك لەواتاکانی نوێژ بە کورتی .

## سورەتی الفاتحة :

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمـَنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان (بە ناوی ئەو خودایەی کە کانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە.

الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایەو بۆ خوایە ، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە .

الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ

بەخشندەو دلۆڤانە ، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانییە (ڕەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، بەڵام لە قیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە.

مَـالِكِ يَوْمِ الدِّينِ

خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە . (پادشای ڕۆژی قیامەتە کە دادپەروەری ڕەهاو بێ سنوری تێدا بەرپا دەکات.

إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ

خوایە تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین.

اهدِنَــــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ

خوایە بەردەوام ڕێنوماییمان بفەرموو بۆ ئەو ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە.

صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ

کە بەرنامەو ڕێبازی ئەوانەیە لە ئازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون ، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە (بە هۆی ئەوەوە دەیزانن و لایانداوە) ، هەروەها نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەش کە سەرگەردان و گومڕان (بە هۆی لاساری و یاخی بوون و نەزانینیانەوە).

## سورەتی الاخلاص :

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ

بلێ ئەو خوایەی کە ناوی ٠ الله — یە خوایەکی تاك و تەنهایە

اللَّهُ الصَّمَدُ

خوا زاتێکی پایەدارو دەسەلاتدارە ، نیازی بە کەس نییە و هەمووان ئاتاجی ئەون ، هەر ئەو دەتوانێت بەلاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازییەکان جێبەجێبکات.

لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ

هیچ کەسی لێ نەبووەو خۆیشی لە کەس نەبووە

وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ

هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەلاتدارێکی تر نییە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

**تێبینی : ئەتوانیت سورەتی تریش بخوێنیت .**

## ﴿واتای نزای ڕکوع و سجودو هەستانەوە لە کاتی نوێژدا﴾

- (سُبحانَ ربِّي العظيم) سێ جار .

واتە/ پاکی و بێ کەموکورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری مەزنە.

- ( سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ )

واتە/ خوای گەورە ستایشی ئەو کەسەی بیست کە ستایشی کردو سوپاس و پێزانینی بۆ دەربڕیوە .

- ( رِبَنا لَكَ الحَمدُ حَمداً كثيراً ، طيباً مبَاركاً فيهِ )

واتە/ پەرودگارمان ستایش بۆ تۆیە. ستایشێکی زۆری پاکی پیرۆز

- ( سُبحَانَ رَبيَّ الأعلى )

واتە/ پاکی و بێ کەموکورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری زۆر بەرزم .

## التحيـــات:

- ( التحيات لله والصلوات والطيبات)

موڵك و مانەوەو گەورەیی درودو پاڕانەوەو ووشەی پاك و چاك هەر بۆ خوایە.

- (السلام عَلَيْكَ أيهَا النَبيُ وَرَحمَة الله وبَرَكاتهُ)

سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لە سەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

- (السلام عَلينا وعلى عباد الله الصالحين)

سڵاوو لە سەر ئێمەش و لە سەر هەموو بەندە چاکەکانی خودای گەورە.

- (أشهد أن لا اله الا الله واشهد أن محمداً عبده ورسوله)

شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە الله ، وە شاهیدی دەدەم کە محمد (صلى الله عليه وسلم) بەندەو نێردراوی خوایە.

- (اللهم صل على محمد وعلى آلِ محمد )

خودایە درودو ڕەحمەت بڕێژە بە سەر محمد (صلى الله عليه وسلم) و خانەوادەو کەس و کاری محمد (صلى الله عليه وسلم) .

- كما صليت على ابراهيم وعلى آلِ ابراهيم.

هەروەك درودت ڕژان بە سەر ابراهیم و کەس و کاری ابراهیم دا (عليه الصلاة و السلام)

- انك حميدٌ مجيد

بەڕاستی تۆ سوپاس کراوو خاوەن شکۆو بەرزیت.

- اللهم بارك على محمد وعلى آلِ محمد

خودایە فەڕ و پیرۆزی بڕێژە بە سەر محمد (صلى الله عليه وسلم) و کەس و کاری محمد دا (صلى الله عليه وسلم) .

- كما باركت على ابراهيم وعلى آلِ ابراهيم .

هەروەك فەڕو پیرۆزیت ڕژاندووە بە سەر ابراهیم و کەس و کارەکەیدا (عليه الصلاة و السلام).

- انك حميد مجيد)

بەڕاستی تۆ سوپاس کراوو خاوەن شکۆو بەرزیت.

- (اللهم حاسبني حساباً يسيراً )

خودایە (لە ڕۆژی دوایدا) بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان لێپرسینەوەم لەگەڵ بکە.

- (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)

سڵاوو بەزەیی و بەرەکەتی خواتان لە سەر بێت .

# ﴿ ئادابی قورئان خوێندن ﴾

١- دەست نوێژ گرتن .

٢- ڕووکردنە قیبلە .

٣- سیواك کردن .

٤- وتنی { أعوذ بالله من الشيطان الرجيم } و { بسم الله الرحمن الرحيم } لە سەرەتای سورەتدا .

٥- شوێنەکەت پاك بێت .

٦- هەوڵدەدەین بە دەنگەوە بیخوێنین .

٧- لەو ئایەتانەی {سجدە}ی تێدایە سوجدە دەبەین و دەڵێین {سجدَ وَجهيَ للذي خلقه وشَقَ سَمعهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقوَتِهِ ، فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الخَالقِينْ} .

٨- ئەگەر باوێشکمان هات دەوەستین تا تەواو دەبێن ، پاشان دەستی پێدەکەینەوە .

٩- ئەگەر پژمیتین دەڵێین (ألحمد لله ) و دەست پێدەکەینەوە.

١٠- هەموو ڕۆژێك دەیخوێنین ئەگەر کەمیش بێت .

١١- لە کۆشماندا یان لە سەر شتێك دایدەنێین و ئینجا دەیخوێنین ـ واتە لە سەر زەوی داینانێین.

١٢- گوێ گرتن لە قورئان ڕۆژانە لە کاسێت . یان مۆبایل یان ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان یان هەر ئامێرێکی تر

١٣- هەڵبژاردنی باشترین کات بۆ قورئان خوێندن وەك : بەیانیان ، ناونوێژ ، شەوان ، پێش بانگ .

١٤- هەوڵدان بۆ فێربوونی ماناکەی .

١٥- هەڵسوکەوت کردن بەپێ ی ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز .

## ﴿ ئادابی خوێندن ﴾

١- بەناوی خوا دەست پێدەکەین

٢- خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی جوان وەك: بەوەفا بوون،ڕاستگۆیی،وره بەرزی

٣- خوێندن لە ژوورێکی پاك و هێمن دا بێت ، واتە ژوورەکە تەلەفزێون و وێنەو نەخش و نیگاری تیا نەبێت و ساردی و گەرمی تەواو بێت

٤- خوێندن لەسەر مێزو کورسی بێت و بەرامبەر پەنجەرە نەبێت

٥- ڕووناکی تەواو بەکار دەهێنین

٦- ئامادەکردنی کەرەستەکانی خوێندن وەك قەڵەم، دەفتەر، کتاب، ڕاستە.

٧- دوور کەوتنەوە لە کێشەکانی ماڵ

٨- خوێندن لە بەیانی زوودا و لە نێوان مەغریب و عیشا و شەواندا

٩- تێگەیشتن پاشان لەبەر کردن

١٠- هەموو بیرو هۆش ودڵ و دەروونت بۆ وانەکە تەرخان بکە

١١- خواردنی جۆراو جۆری وەك :هەنگوین، گوێز، ترێ، زەیتوون، خورما، شیر، چا، کێك، کولەکە

١٢- خوێندنی ڕۆژانەو کۆنەکردنەوەی لەسەر یەکو کات بەفیڕۆنەدان

١٣- لەکاتی پشوودا بۆچەند دەقەیەك سەیری دارو درەخت و سەوزایی دەکەین یان سەیرکردنی ئاسمان بۆ چەند ساتێك

١٤- پێشبڕکێ کردنی قوتابیە زیرەکەکان

١٥- لەبەرکردنی شیعر یان چیرۆك یان پەندی پێشینان ووتنی لە پۆلدا

١٦-خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەو نەترسان لێی.

١٧-خوێندنی سەر بابەتەکان پاشان خوێندنی هەمووی

١٨-خوێندن بەدەنگی بیستراو

١٩- سەردانی کردنی کتێبخانەکان

٢٠- ئەنجامدانی چالاکی وەرزشی

٢١-سود وەرگرتن لە پرسیاری رۆژانە

٢٢-دیاری کردنی خاڵە گرنگەکان

٢٣-نێو کاتژمێر خەوتن لە پێش نیوەڕۆ.

٢٤-وتنەوەی ئەوانەی فێری بوویتە بەکەسانی تر

٢٥-رێزگرتنی مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانەو کارگوزرارەکان

٢٦-هەوڵدان بۆ پاك ڕاگرتنی قوتابخانە

٢٧-لەکاتی چوون بۆ قوتابخانە ئاگاداری سەر ڕێگاکان دەبین و لەنزیك قوتابخانە شتی سەر دانەپۆشراو ناخۆین

٢٨-پاڕانەوە لە خوای بالا دەست.

# ﴿ئادابی پاڕانەوە﴾

١- هەڵبژاردنی باشترین کات ، وەك : بەیانیان ، پێش خۆر کەوتن ، دوای نوێژە فەرزەکان ،کاتی سوجدە ، شەوان ، نێوان بانگ و قامەت .

٢- دەنگ نزم کردنەوە .

٣- لە پێش ودوای نزاکە بڵێ :

{الحمدلله ، أللهم صل علی محمد و علی آل محمد } .

٤- سێ بارەکردنەوەی نزاکە – واتە :- هەر شتێکت داواتکرد سێ جار بیڵێ .

٥- دەست نوێژ گرتن پێش نزاکردن ، ئەگەر کرا.

٦- دەست بەرزکردنەوە .

٧- بە ناوە جوانەکانی خوا داوا بکە ، وەك { یا سمیع ، یا بصیر ، یا علیم ...هتد}

٨- ڕووکردنە قیبلە .

٩- لە کاتی پاڕانەوەدا دڵت لای پاڕانەوەکە بێت.

١٠- پەلە نەکردن لە قبووڵ بوونی پاڕانەوەکەت .

١١- سەرەتا بۆ خۆت پاشان بۆ کەسانی تر بپاڕێرەوە .

١٢- هەوڵدەین بەردەوام هەموو پێداویستێکانمان لە خوای گەورە داوا بکەین و ساردوسڕ نەبین لە پاڕانەوەکانماندا .

١٣- کۆتایی پاڕانەوەکانمان بە سڵاوات دان لە سەر پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) دێنین .

وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ

# ﴿ ئادابی سەلام کردن ﴾

١- پابەندبوون بە سەلامەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرمێ :
{السلام عليكم و رحمة الله و بركاته} وەلامەکەشی {وعليكم السلام و رحمة الله و بركاته}

٢- تاکو سەلام نەکەین قسە ناکەین .

٣- هەوڵبدە یەکەم جار خۆت سەلام بکەیت .

٤- دووبارە سەلام دەکەینەوە ئەگەر مەجلیسەکەمان بۆ ماوەیەکی کورت جێهێشت .

٥- بە شێوەیەك سەلام دەکەین کە هەموو کەس گوێ ی لێبێت .

٦- سەلام کردن لە ماڵ و کەسوکاری خۆت دەڵێن (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

٧- ئەگەر کەس لە ماڵ نەبوو بڵێ : {السلام علينا و على عبادِالله الصالحين }

٨- بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە سەلام دەکەین و وەلامی سەلام دەدەینەوە .

٩- لە کاتی وەستاندا تەوقە دەکەین و دەستی یەکتر دەگوشین .

١٠- ئەگەر سەلامت لێکرا هەوڵ بدە زوو وەلامەکەی بدەیتەوە .

١١- سوننەتە سوار بوو سەلام لە پیادە بکات و پیادە لە دانیشتوو و کەم لە زۆر و بچوك لە گەورە .

١٢- لە شەودا سەلام بە دەنگی نزم دەکەین -واتە: هەرکاتێك لە شوێنێك کەسێك خەوتبوو سەلام بە نزمی دەکەین لە کەسانی تر .

١٣- سەلام لەم کەسانە ناکەین : خەوتو، کەسێك نوێژ بکات، یا خود تیکەی لە دەم بێت. دەتوانین دواتر سەلامیان لێبکەین.

# ﴿ ئادابی چوون بۆ مزگەوت ﴾

١- دەست نوێژ گرتن لەماڵ .

٢- جلی جوان لە بەر دەکەین و قژمان شانە دەکەین .

٣- خۆمان بۆن خۆش دەکەین .

٤- زوو ڕۆشتن بەرەو مزگەوت .

٥- بە هێمنی بەرەو مزگەوت دەڕۆین .

٦- پێش بانگ دەگەینە مزگەوت .

٧- بە پێ ی ڕاست دەچینە ناو مزگەوتەوە و ئەم دوعایە دەخوێنین :
{أللهم افتح لي أبواب رحمتك } .

٨- سیواك كردن .

٩- ڕێك ڕادەوەستین لە كاتی نوێژدا .

١٠- دوو ڕكات نوێژی سونەتی (تحية المسجد ) دەكەین .

١١- دەنگ بەرز ناكەینەوە .

١٢- خوێندنی قورئان پێش بانگ .

١٣- پاڕانەوە لە نێوان بانگ و قامەتدا .

١٤- لە گەڵ هاوڕێكانمان پێ و شانمان جووت دەكەین .

١٥- نابێت بۆنی ناخۆشمان لێبێت وەكو : بۆنی سیر و پیاز و گۆرەوی .. هتد.

١٦- بەردەوام ڕێز لە نوێژ خوێنان دەگرین بە تایبەتی مامۆستای مزگەوت و كەسانی لە خۆمان گەورەتر .هەروەها ڕێزی مزگەوتەكەش دەگرین ودەیپارێزین.

١٧- بە پێ ی چەپ دەچینە دەرەوە و ئەم دوعایە دەخوێنین : {بِسْمِ اللهِ وَ الصَلاةُ وَ السَّلامُ علَى رَسُولِ اللهِ ، اَللّهُمَّ إنّي أسْألُكَ مِنْ فَضْلِكَ ، اَللّهُمَّ اعْصِمْني مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ}. واتە: بەناوی خوا،درودو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ خوایە من داوای فەزڵی خۆتت لێدەكەم، خوایە بم پارێزە لە شەیتانی نەفرەت لێكراو.

# ﴿ ئادابی رۆژی هەینی ﴾

١- خۆ شۆردن و نینۆك کردن و سەرچاك کردن .

٢- جلی جوان لەبەر کردن و خۆ بۆن خۆشکردن و سەر چەور کردن بە زەیت.

٣- زوو رۆشتن بەرەو مزگەوت .

٤- نابێت ئازاری خەڵك بدەین بەوەی کە بە سەریاندا بازدەین و برۆین.

٥- کە چووینە ژوورەوە دوو رکات نوێژی سوننەت دەکەین .

٦- سیواك کردن .

٧- خوێندنی سورەتی (الكهف) .

٨- زۆر صلاوات دان لە سەر پێغەمبەر {صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسلم} بڵێ (اللهم صل علی محمد و علی آل محمد).

٩- لە کاتی وتاردا بە وریاییەوە گوێ لە وتارەکە دەگرین و خۆمان خەریك ناکەین بە هیچ شتێکەوە ..

١٠- زۆر پاڕانەوەو داواکردن بە تایبەتی لە دوای نوێژی عەسرەوە.

## ﴿ئادابی وەڵام دانەوەی بانگ﴾

١- هەموو بانگەکە وەك خۆی دەڵێینەوە ، جگە لە برگەی { حيٌ على الصلاة و حيٌ على الفلاح} لە وەلامیدا دەلێن :{لا حول ولا قوة الا بالله }.

٢- لە کاتی بانگەکەدا پێش بانگدەر ناکەوین .

٣- دوای تەواو بوونی بانگەکە :

أ- صلاوات دەدەین لەسەر پێغەمبەرﷺ دوای بانگ .دەلێن:

(اللهم صل على محمد و على آل محمد )

ب- وتنی ئەم دوعایە : {أللهم رب هذه الدعوة التامة و الصلاة القائمة ، آتِ محمداً الوسيلة و الفضيلة ، و ابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته }.

٤- نزاکردن لە نێوان بانگ و قامەتدا .

****************************************

## ﴿ ئادابی دانیشتن ﴾

١- سەلام کردن لە کاتی هاتن و رۆشتن .

٢- نابێت کەسێك لابدەین و کەسێکی تر لە جێگەی دانێین . مەگەر پێویست بێت و لای کەسەکەش ئاسایی بێت.

٣- دانەنیشتن لە ناوەراستی مەجلیسدا .

٤- دورکەوتنەوە لەو شوێنەی کە خاوەن ماڵ کاری پێیەتی .

٥- یاری نەکردن بە پەنجەکانت . ٦- پەنجە نەکردنە لووت و گوێچکەدا .

٧- بە شکۆو بە رێزەو دانیشتن . ٨- پاراستنی پاك و خاوێنی .

٩- فرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە .

١٠- لە کۆتایی دانیشتنەکەدا بڵێ :(سبحانك اللهم بحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب اليك ) .

١١- ئەگەر کەسێك قسەی بۆ کردی بە جوانترین شێوە گوێ ی بۆ دەگرین و خۆمان بە شتی ترەوە خەریك ناکەین .

# ﴿ ئادابی ڕێگاوبان ﴾

١- یارمەتی دانی کەسانی بێ توانا .

٢- لادانی ئازار لە سەر ڕێگا وەك بەرد و دارو دڕك .

٣- پارێزگاری کردنی پاك و خاوێنی .

٤- بە وریایی ڕۆشتن لە ڕێگادا .

٥- نەخواردنی خواردەمەنی بە دەم ڕێگاوە .

٦- کات بە زایەع نەدان .

٧- سەلام کردنو وەڵام دانەوەی .

٨- پێشنەکەوتنی کەسانی بە تەمەن .

٩- نەرم و نیانی بەرامبەر بە خەڵکی .

١٠- دەنگ بەرز نەکردنەوە.

١١- ڕێنمایی کردنی کەسانی نەشارەزا .

١٢- فەرمان کردن بە چاکە وڕێگە گرتن لە خراپە بە پێ ی توانا .

١٣- دوور کەوتنەوە لە شوێنە زۆر قەرەباڵغەکان .

١٤- بە جوانترین شێوە دەڕۆین بە ڕێگادا .

# ﴿ ئادابی گەشت و گوزار ﴾

١- کە سواری سەیارەکە بووین دەڵێین : ( اللّٰه أكبر ، اللّٰه أكبر ، اللّٰه أكبر . سبحان الذي سخّر لنا هذا وما كنا له مقرنين ) واتە : تەنها خوا گەورەیە (٣)جار ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆی ڕەخساندین ، ئەگەر ویستی خوای گەورە نەبوایە ئێمە نەمان دەتوانی بە دەستی بهێنین )

٢- پەناگرتن بە خوا لە ناخۆشیەکانی سەفەر .

٣- لە شوێنی بەرزایی دەڵێین {اللّٰه أكبر }و لە نزمایی دەڵێین { سبحان اللّٰه } .

٤- سەرنج دان لەوشتانەی کە لە سەفەرەکە دەیبینین .

٥- هەڵبژاردنی باشترین هاوڕێ بۆ سەفەر .

٦- خوا حافیزی کردن پێش دەرچوون لە ماڵ .

٧- سەفەرکردن لە ڕۆژی پێنج شەممەدا ئەگەر کرا .

٨- سەفەر نەکردن بە تەنها .

٩- پاڕانەوە بۆ خۆت و کەس و کارت .

١٠- دانانی پلانێکی تەواو بۆ سەفەرەکەت .

١١- پارێزگاریکردن لە نوێژە فەرزەکان و زیکرەکان .

١٢- کڕینی دیاری بۆ خۆشەویستان .

١٣- کردنی دوو ڕکات نوێژ پێش دەرچوون لە ماڵ.

١٤- هەمان نزا بخوێنە لە گەڕانەوەدا .

١٥- زانینی ناوی ئەو هاوڕێیانەت کە بوونەتە هاوڕێت لە سەفەرەکەدا .

١٦- خۆ پاراستن لەوجۆرە سەفەرانەی ناشەرعین

# ﴿ ئادابی زمـــــان ﴾

١- ڕاستگۆبین .          ٢- هەوڵی چاکە کردن بدەین و خراپە لابەرین .

٣- دوو زمانی و گاڵتە بە هیچ کەس نەکەین .

٤- سوپاسی کەسێك بکە ئەگەر چاکەی لە گەڵ کردی .

٥- بە زمانمان یارمەتی خەڵکی دەدەین .

٦- ئازاری کەس نادەین بە زمان .

٧- بەجوانترین شێوە قسەدەکەین .

٨- درۆ ناکەین بۆ ئەوەی خەڵك پێبکەنن .

٩- زمانمان بە قورئان و یادی خودا پاراو دەکەین .

١٠- دەنگمان بەرز ناکەینەوە بە سەر کەسی لە خۆمان گەورەتر .

١١- هەوڵ دەدەین بەردەوام زمانمان شیرین بێت و خۆمان لە قسەی ڕەق و ناشرین دەپارێزین .

١٢- ئەگەر بینیت کۆمەڵێك پێکەوە قسەدەکەن لە خۆتەوە تێکەڵیان مەبە تاکومۆڵەت وەردەگریت و ڕێگەت پێدەدەن .

١٣-ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون نابێ دوانیان بە چرپەو پەنهانی یان بە زمانێکی تر قسەبکەن و ئەوی تر فەرامۆش بکەن، چونکە ئەو کەسە هەست بە کەموکووڕی دەکات .

١٤- پێویستە کە قسە دەکەیت بە چاکی بیری لێبکەیتەوە و هەڵقوڵاوی ناخی دڵت بێت .

١٥- پێویستە ڕوو گەش و دەم بە خەندە بیت و نابێت ڕوو گرژبیت.

١٦- لە قسەکردندا نەرم و نیان بین .

١٧- ئەگەر کەسێك قسەی دەکرد جوان گوێی بۆ دەگرین و قسەکەی پێ نابڕین تاوەکو قسەکەی تەواو دەبێت.

١٨- نابێ لە ناو کۆمەڵە کەسێکدا کەسێك ئامۆژگاری بکەین بەڵکو دەبێت بە تەنها و دوو بە دوو ئامۆژگاری دەکەین .

## ﴿ ئادابی هاوڕێیەتی ﴾

١- هەڵبژاردنی باشترین هاوڕێ .

٢- لێبوردە بیت بەرامبەری .

٣- سەردانی کردنی و یارمەتی دانی .

٤- دڵسۆزی و بە وەفابوون .

٥- ڕوو گەش و زمان نەرم و سنگ فراوان بیت .

٦- داپۆشینی عەیبەکانی و دەرخستنی جوانیەکانی .

٧- بەشداری کردنی خۆشی و ناخۆشی .

٨- منەت نەکردن بە سەریدا گەر چاکەیەکمان لەگەڵیدا کرد .

٩- سوپاسی هەرکەسێك دەکەین کاتێك چاکەیەکی لەگەڵمان کرد

١٠- بەردەوام بوون لە سەر خۆشەویستی .

١١- هەر بەڵێنێکماندا دەیبەینە سەر بە پێی توانا .

١٢- کارێکی خراپی کرد ئامۆژگاری دەکەین .

١٣- ڕاستگۆ دەبین بەرامبەر یەکتر .

١٤- پاڕانەوە لە خوای گەورە بۆ هەموو هاوڕێکانمان .

١٥- ئەگەر تووڕە بووین زوو ئاشتدەبینەوە و دڵمان فراوان بێت .

١٦- بەیەك گەیشتین سەلام و تەوقە دەکەین و دەستی یەکتر دەگوشین .

## ﴿ ئادابی میوانداری ﴾

١- ڕێنمایی کردنی بۆ ژووری پێشوازی .

٢- نیشاندانی شادومانی و دڵخۆشی .

٣- حیکایەت و قسەی خۆش کردن .

٤- ڕازاندنەوەی سفرە بە بێ زیادڕەوی .

٥- فەرموو کردن لە میوان پاشان خۆت بخۆ .

٦- نزاکردن بۆ خاوەن ماڵ .بڵێ :(أَللهُمَّ بارِكْ لَهُمْ في ما رَزَقْتَهُمْ وَ اغْفِرْ لَهُمْ وَ ارْحَمْهُمْ)

واتە :خوای گەورە بەرەکەت بکەیتە ڕزق و ڕۆزییانەوە و لێیان خۆشبەو ڕەحمیان لێبکە.

٧- خۆ پاراستن لە هەموو گوفتارو کردارێك کە دەبێتە هۆی ئازاردانی خاوەن ماڵ .

٨- دوای میوانەکە دەست لە خواردنەکە هەڵدەگرین .

٩ - پاراستنی شتومەکی خاوەن ماڵ

١٠- نابێ میوان پێش خاوەن ماڵ بکەوێت .

١١- ڕۆشتن لە گەڵیدا تا وەکو بەردەرگا و بەگەرمی بەخێرهاتنی کردنی .

## ﴿ئادابی گوێ گرتن﴾

١- نابێت گوێ لە قسەی کەسێك بگریت کە پێی ناخۆشبێت .

٢- گوێ نەگرتن لە دراوسێ بە نهێنی.

٣- گوێ نەگرتن لە شتی حەرام وەك گۆرانی حەرام و غەیبەت و جنێوو ئازاردانی خەڵکی و هەرشتێکی تر.

٤- گوێ گرتن لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرﷺو وتارو سروودە ئیسلامیەکان.

٥- کاتێك کەسێك قسەمان بۆ دەکات دەبێت بە جوانترین شێوە گوێ ی بۆ بگرینو خۆمان بە شتی ترەوە خەریك ناکەین وەك تەسبیح و مۆبایل و ...هتد .

## ﴿ ئادابی دراوسێیەتی ﴾

١- ئەگەر پێی گەیشتین سەلامی لێدەکەین .

٢- نەرم و نیان و ڕوو خۆش دەبین .

٣- یارمەتی دانی لەکاتی پێویستدا .

٤- ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی دەکەین .

٥- بەشداری کردنی لە خۆشی و ناخۆشیدا .

٦- چاو نابڕینە شتوومەکەکانی .

٧- دراوسێ لای دراوسێ سووك ناکەین.

٨- ئارام گرتن لە سەر ئازارە کانی .

٩- دەنگی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەرز ناکەینەوە .

١٠- سەیری ناو ماڵیان ناکەین .

١١- ئەگەر شتێکی تازەیان کڕی پیرۆزباییان لێدەکەین .

١٢- بەردەوام دوعای خێر و هیدایەت و خۆشیان بۆ دەکەین .

١٣ ـ خۆ دوور گرتن لە هەرشتێك کە دەبێتە هۆی ئازاردانی دراوسێکانمان .

# ﴿ ئادابی سەردانی نەخۆش ﴾

١- چەند کەسێك کۆدەکەینەوە و دەچین بۆ لای .

٢- دیاریەکی بۆ دەبەین وەك گوڵ یان شیرینی بە پێی توانا.

٣- ئامۆژگاری دەکەین بە ئارامگرتن لە سەر نەخۆشیەکەی .

٤- نزای بۆ دەکەین و دەڵێین (لا بأس طهورٌ انْ شاءَ اللهُ )

پاشان {٧} جار بڵێ :(أسألُ اللهَ العظيمَ ربَّ العَرْشِ العظيم أنْ يَشْفيك)

٥- یادی نەخۆشەکە بخەرەوە کە دەستی بخاتە سەر شوێنی ئازارەکەو (٣)

جار بڵێ :

(بسم الله ) و (٧) جار بڵێ :(أعوذُ بِاللهِ و قُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أجِدُ و أُحَاذِرُ ) .

٦- داوای نزای خێری لێ بکە چونکە نزای نەخۆش لای خوا گیرایە .

٧- زۆر دانانیشین مەگەر زۆر پێویست بکات . یان پێی خۆش بێت.

٨- بیری خەرەوە کە خوای گەورە لای نەخۆشەو رێزی تایبەتی لێدەگرێت

بەپێی فەرموودەی قودسی .

٩- لەکاتی بەجێهێشتنی نەخۆش دەڵێین چیت پێویستە ئێمە لە خزمەتداین و

ئەگەر زانیمان نەخۆشەکە هەژارە شتێك یارمەتی ماددی بۆ کۆدەکەینەوە.

## ﴿ ئاداب لەگەڵ دایك و باوكدا ﴾

١- سەلام كردن لێیان كاتی دەرچوون و هاتنەوە .

٢- ڕوو خۆش و زمان نەرم دەم بە خەندە دەبین بەرامبەریان .

٣- دەنگ بەرز ناكەینەوە بە سەریاندا وە دەنگی ڕادیۆو تەلەفزیۆن بەرز ناكەینەوە.

٤- وەك هاوڕێیەكی چاك دەبین لە گەڵیان .

٥- پێشیان ناكەوین لە ڕۆشتندا .

٦- دورخستنەوەی ناخۆشی لە سەر یان .

٧- داوای مۆڵەتیان لێدەكەین كە دەرچووین لەماڵ .

٨- هاوكاریان دەكەین لە ماڵ و دەرەوە .

٩- تورە نابین بەرامبەریان كە تورە بوون لێمان .

١٠- بەردەوام نزای خێریان بۆ دەكەین لە پێش مردن و دوای مردن .

١١- بەجوانترین شێوە بانگیان دەكەین وەك بابە گیان ، دایە گیان .

١٢- سەردانی گۆڕەكانیان دەكەین لە پاش مردنیان .

١٣ ـ خۆمان دەپارێزین لە هەموو ئەو گوفتارو كردارانەی دەبنە هۆی ئازاردانیان .

## ﴿ ئادابی ئاو خواردنەوە ﴾

١- ووتنی {بسم الله } لە سەرەتاوە و ووتنی {ألحمد لله} لە کۆتاییدا .

٢- بەدانیشتنەوە ئاودەخۆینەوە .

٣- بە سێ جار ئاو دەخۆینەوە ، لە نێوانیاندا هەناسە دەدەین لە دەرەوەی پەرداخەکە .

٤- پەرداخێك درزی تێدا بوو یان شکابوو ئاوی تێدا ناخۆینەوە .

٥- ئەوەندە بکەرە ناو پەرداخەکەوە کە بۆت دەخورێتەوە .

٦- ئاومان دابەشکرد لە گەورەوە دەست پێدەکەین، پاشان لەلای ڕاستی گەورەکەوە.

٧- بە ئارامی ولەسەرخۆ ئاو بخواتەوە پەلەی لێ نەکات و دەنگە دەنگیش نەکات

٨- ئەو کەسەی ئاو دابەش دەکات دەبێت لە کۆتایدا ئاو بخواتەوە.

## ﴿ ئادابی نان خواردن ﴾

١- ووتنی {بسم ألله }لە سەرەتاوە ، ئەگەر بیرمان چوو دەڵێین{بسم الله في أوله وآخره}

٢- شۆردنی هەردوو دەست لە پێش و پاشی خواردن .

٣- بەدەستی ڕاست دەخۆین .

٤- لە بەردەم خۆمانەوە دەخۆین .

٥- پێویستمان بە شتێك بوو بە هێمنی داوای دەکەین .

٦- خواردنێکمان بە دڵ نەبوو قسەی پێناکەین .

٧- باس نەکردنی شتی قێزەوون لە کاتی نان خواردندا .

٨- بە پەنجەکانت نان بخۆ و پاشان پەنجەکانت بلێسەوە.

٩- ئەوەی لە دەستمان کەوتە خوارەوە پاکیدەکەینەوە و دەیخۆین .

١٠- ئەگەر بکرێت میوە لە پێش نان خواردنەوە دەخۆین.

١١- کەسی گەورە دەستی پێکرد ئینجا ئێمەش دەستی پێدەکەین .

١٢- لە کاتی نان خواردنی میوانەکانماندا تەماشایان ناکەین.

١٣- ئەگەر میوانمان هەبوو زۆری لیّ ناکەین بۆ زۆر خواردن .

١٤بەڕاکشانەوە نان ناخۆین .

١٥- لە کۆتاییدا دەڵێین :(اَلْحَمْدُ للهِ اَلذي أَطْعَمَني هذا وَرَزَقَنيهِ مِنْ غَيْرِ حَـوْلٍ مِنّـي وَلا قُوة).

واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم خواردنەی پێدام بـەبێ هـیچ هێـزو توانایەکی من ڕزق و ڕۆزومی دا .

## ﴿ ئادابی جل و بەرگ لە بەرکردن ﴾

١- لە پێشدا لای ڕاست لەبەر بکەو بڵێ :(اَلْحَمْدُ للهِ الذي كَسَاني هذا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلا قُوة )

٢- لە کاتی جل داکەنیندا بڵێ { بسم الله }.

٣- کەسێك پۆشاکی نویّ ی لەبەر کردبۆ خۆی دەڵێ { ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم پۆشاکەی پۆشیم و پێی بەخشیم بە بێ هیچ گۆڕان و توانای خۆم } پێیی بڵێ (اِلْبِسْ جَديداً ، وَعِشْ حَميداً ، وَمُتْ شَهيداً )

واتە : هەمیشە پۆشاکی تازە لەبەر بکەیت و ژیانت خۆشی بێت وبەسەربەرزی و شەهیدیش بمری .

٤- لەبەرکردنی جلی سپی .

٥- جل و بەرگەکانمان پاك و خاوێن ڕادەگرین.

٦- ئوتوو کردنی و ڕێك و پێك کردنی.

٧- لە کاتی خەوتندا جل و بەرگی خەوتن لەبەر دەکەین .

## ﴿ ئادابی نەعل و پێڵاو لە پێکردن ﴾

١- سەرەتا پێی ی ڕاست لە پێ دەکەین .

٢- ئەگەر پێڵاو و نەعلمان داکەند سەرەتا پێ ی چەپ دادەکەنین .

٣- بەیەك تاك نارۆین بە زەویدا چونکە نەهی لێکراوە .

## ﴿لە کاتی پژمیندا﴾

١- ئەگەر پژمیت بڵێ : ( الحمد لله ) .

٢- هاوڕێکەت بڵێ : ( یرحمك الله ) .

٣- تۆ دەڵێ ی : ( یهدیکم الله و یصلح بالکم ) .

٤- لە کاتی پژمیندا هەوڵدە دەستت یان دەستە سڕێك بخەیتە سەر لووتت ، یان ڕوو بکەیتەدواوە .

٥- لە سەر خۆ بپژمەودەنگ بەرز مەکەرەوە .

******************************

## ﴿لەکاتی باوێشکدان﴾

١- تا دەتوانی بیگەڕێنەوە .

٢- دەست دانان لە سەر دەمت .

٣- دەنگ بەرز مەکەرەوە .

## ﴿ ئاداب لەگەڵ ئاژەڵدا ﴾

١- بەسۆز و بەزەیی بین بەرامبەریان .

٢- ئازاریان نادەین و جنێویان پێنادەین .

٣- یارمەتی دانیان .

٤- زیاتر لە توانای خۆیان باریان لێنایننێن .

٥- نابێت دایکەو بەچکە لەیەك جیابکەینەوە تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێت.

٦- ئەگەر برسی یان تینووبوون تێریان دەکەین.

٧- ئەگەر نەخۆش یان بریندار بوون هەوڵی چارەسەر کردنیان دەدەین لە ڕێگای کەسانی شارەزاوە.

# ﴿ئادابی چوونە سەر ئاو﴾

١- لەپێش چوونە ژوورەوە بڵێ:(بِسْمِ الله ، اَللَّهُمَّ اِنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَ الْخَبَائِث )

٢- بە پێی چەپ دەچینە ژوورەوە و بە پێی ڕاست دێینە دەرەوە و دەڵێن (غفرانك).

٣-قورسایی دەخەینە سەر پێی چەپ .

٤- قسە ناکەین و شت ناخۆین .

٥- سەیری پاشەڕۆی خۆمان ناکەین .

٦- سەیری ئاسمان ناکەین .

٧- بە دەستی چەپ خۆمان پاکدەکەینەوە .

٨- ئەگەر لە دەشت بووین ڕوو یان پشت لە قیبلە ناکەین .

٩- بە ڕەوو ڕووی با دانانیشین .

١٠- لە سەر زبڵ دانانیشین .

١١- بە ئێسك و ڕووەك خۆمان پاك ناکەینەوە . ئەگەر ئاونەبوو بە بەرد یان بە خۆڵ خۆمان خاوێن دەکەینەوە .

١٢- لە سەر ڕێگاو سێبەری دارو قەبرسان دانانیشین .

١٣- نە سەلام دەکەین و نە وەڵامی سەلامیش دەدەینەوەنەوە .

١٤- لە کۆتایدا بە ئاوو سابوون دەستمان دەشۆرین.

# ﴿ ئادابی خەوتن ﴾

١ – پێش خەوتن دانەکانمان بە فڵچە دەشۆرین پاکیان دەکەینەوە.

٢– جلی تایبەتی خەو لەبەر دەکەین کە نەرم و فراوان بێت.

٣ – هەوڵدەدەین بە دەست نوێژەوە بخەوین ، چونکە هەر کەسێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت ئەوە خوای گەورە فریشتەیەکی تایبەتی بۆ دەنێرێت تا بەیانی دوعای بۆ دەکات .

٤– گڵۆپەکان دەکوژێنینەوە لە کاتی نوستندا .

٥– لەسەر سك ناخەوین .

٦– زوو دەخەوین و زوو هەڵدەسین .

٧– خوێندنی زیکرەکان:ـ گرنگترینیان ئەمانەن : ـ

أ– {قل هو اللهُ أحد} و {ألفلق } و {الناس} هەریەك لەو سورەتانە سێ جار بخوێنین لە گەڵ فوو کردن بە لەپی دەستداو هێنانی بە لاشەدا .

ب– خوێندن {آية الكرسي} ﴿بسم الله الرحمن الرحيم (اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ)﴾ .

جـ – خوێندنی سورەتی الفاتحة (یەك جار).

د– ووتنی (٣٣سبحان الله ) و (٣٣ الحمد لله ) و (٣٤ الله اكبر ) .

ھ- خوێندنی سورەتی (ألملك) هەرکەسێك بیخوێنێت ئەوە ئەو سورەتە شەفاعەتی بۆ دەکات لە قیامەت .

و- (٣) جار بڵێ :(أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ) .

٨- لە سەر لای ڕاست بخەوە و دەست بخەرە ژێر ڕوومەتت و بڵێ :(بِاسْمِكَ أَللَّهُمَّ أَمُوتُ وَ أَحْيَا) واتە : بەناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم.

٩- لێپرسینەوەی خۆت بکە لەو کردەوانەی کە لەو ڕۆژەدا ئەنجامت داوە.

١٠- ئەگەر خەوی ناخۆشمان بینی لەسەر ئەو لایە وەردەگەڕێین و (٣) جار تف بەلای چەپدا دەکەینو دەڵێین :(أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) خەونەکەش لای کەس ناگێڕینەوە.

١١- ئەگەر خەوی خۆشمان بینی تەنها لای خۆشەویستی خۆمان دەیگێڕینەوە.

١٢- بەیانی خەبەرمان بۆیەوە دەڵێین :(أَلْحَمْدُ للهِ الذي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَاَلَيْهِ النُشُور) واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینییەوە دوای ئەوەی مراندینی.

ابراهيم وعلى آلِ ابراهيم انك حميد مجيد}یان صلاواتەکە بەم شێوەیە دەڵێین:
{ اللهم صل على محمد وعلى آلِ محمد } .

٨- ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو دەڵێین{اللهم اني أسألك من فظلك }.

٩- ئەگەر گوێتان لە دەنگی سەگ و گوێ درێژ بوو دەڵێین { أعوذ بالله من الشيطان الرجيم }.

١٠- ئەگەر شتێکی سەیرمان بینی دەڵێین { سبحان الله يان الله اكبر } .

١١- ئەگەر ناخۆشییەك هات بەسەرمان دەڵێین { انا لله وانا اليه راجعون }یان { الحمد لله على كُلِ حَال }.

١٢- لە کاتی تورە بوون بڵێ {أعوذ بالله من الشيطان الرجيم }.

١٣- ئەگەر کەسێك چاکەی لە گەڵ کردی بڵێ { جَزاكَ اللهُ خَيْراً } .

١٤- ئەگەر چوویتە بازاڕ بڵێ { لا اله لا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير ، يحي ويميت وهو حيٌ لا يموت بِيَدهِ الخير وهوعلى كل شيءٍ قدير } هەمان نزا (١٠) جار دوای نوێژی مەغریب و بەیانی .

١٥- ئەگەر لەماڵ دەرچووی بڵێ {بِسْمِ اللهِ تَوَكَلْتُ علَى الله وَلا حَوْلَ وَلا قُوةَ الا بِاللهِ}

١٦- لەکاتی سەیرکردنی ئاوێنە بڵێ {اللهُم ّأنتَ حَسنَتَ خَلْقي فَأحْسِنْ خُلُقِي }.

١٧- ئەگەر موسڵمانێك پێکەنی پێی بڵێ { اضْحَكَ اللهُ سِنَّكَ }

١٨- لە کاتی باران باریندا بڵێ { اللهُمَّ صَيبًا نَافِعاً }

واتە: خوایە بارانێکی بەلێزمەی بەسوودبێت.

# ﴿هەندێ لە نوێژە سوننەتەکان﴾

١- دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی .

٢- نوێژی چێشت تەنگاو (٢ - ٤ - ٦ - ٨ } ڕکات .

٣- دوو ڕکات سوننەتی دەست نوێژ .

٤- دوو ڕکات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا .

٥- دووڕکاتی چوونە ناو مزگەوتەوە .

٦- شەو نوێژ (١١) ڕکات ، ڕکاتی کۆتایی بە تاك دەکرێ .

٧- (٢ یان ٤) ڕکات پێش نیوەڕۆ . (٢ یان ٤) ڕکات پاش نیوەڕۆ .

٨- دوو یان چوار ڕکات پێش نوێژی عەسر .

٩- دوو ڕکات پێش نوێژی مەغریب ، دوو ڕکات پاش مەغریب .

١٠- دوو ڕکات پێش نوێژی خەوتنان، دوو ڕکات پاش نوێژی عیشا .

# ﴿ناوە جوانەکانی خوای گەورە﴾

پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەو ناوانەوە فەرمویەتی (إن لله تعالي تسعة وتسعين اسماً مائة الا واحدا، مَن أحصاها دخل الجنة، انه وتر يحب الوتر)، واتە بێگومان خوای بەرز نەوەد ونۆ ناوی هەن، سەد جگە لە یەکێك، هەر کەسێك کۆیان بکاتەوە دەچێتە بەهەشتەوە، بێگومان ئەو تاکەو تاکی خۆش دەوێت. (هو الله الذي لا اله الا هو:

| | |
|---|---|
| ١. الرحمن | بەبەزەیی |
| ٢. الرحيم | بەخشندە |
| ٣. الملك | سەرۆك، پاشا |
| ٤. القدوس | پاك |
| ٥. السلام | بێ عەیب،بێ پەڵە |
| ٦. المؤمن | دڵنیاکار، بەڕاست دانەر |
| ٧. المهيمن | چاودێر |
| ٨. العزيز | دەسڵاتدار |
| ٩. الجبار | باڵا دەست |
| ١٠. المتكبر | خۆ بەگەورەزان |
| ١١. الخالق | بنیات نەر |
| ١٢. الباريء | بەدی هێنەر |
| ١٣. المصور | وێنەکێش |
| ١٤. الغفار | لێبوردە |
| ١٥. القهار | گەردن کەچکار |
| ١٦. الوهاب | بەخشەر |

| | |
|---|---|
| ١٧. الرزاق | ڕۆزی دەر |
| ١٨. الفتاح | دەروکەرەوە |
| ١٩. العليم | زانا |
| ٢٠. القابض | لێگرەوە |
| ٢١. الباسط | فراوانکار |
| ٢٢. الخافض | نەوی کار |
| ٢٣. الرافع | بەرزکەرەوە |
| ٢٤. المعز | عیزەت بەخش |
| ٢٥. المذل | مل پێ کەچکار |
| ٢٦.السميع | بیسەر |
| ٢٧.البصير | بینەر |
| ٢٨.الحكم | فەرمان ڕەوا |
| ٢٩.العدل | دادگەر |
| ٣٠. اللطيف | وردبین |
| ٣١.الخبير | شارەزا |
| ٣٢.الحليم | هێدی |
| ٣٣.الغفور | لێبوردە |
| ٣٤. العظيم | مەزن |
| ٣٥. الشكور | سوپاس گوزار |
| ٣٦. العلي | بەرزو بڵند |
| ٣٧.الكبير | گەورە |
| ٣٨. الحفيظ | پارێزەرە |
| ٣٩. المقيت | دەسڵاتدار |

| | |
|---|---|
| ٤٠. الحسيب | لێپرسەرەوە |
| ٤١.الجليل | سیفەت بەرز |
| ٤٢. الكريم | بەڕێز |
| ٤٣.الرقيب | چاودێر |
| ٤٤. المجيب | وەڵامی پاڕانەوە دەداتەوە |
| ٤٥. الواسع | فراوان |
| ٤٦. الحكيم | لێزان و دانا |
| ٤٧. الودود | خۆشویستراو |
| ٤٨.المجيد | پایەبەرز |
| ٤٩. الباعث | زیندوو کەرەوە |
| ٥٠. الشهيد | ئاگادار |
| ٥١. الحق | ڕاست |
| ٥٢. الوكيل | پشت وپەنا |
| ٥٣. القوي | بەتوانا |
| ٥٤.المتين | بەهێز |
| ٥٥.الولي | یاریدەدەر |
| ٥٦. الحميد | شایستەی سوپاس |
| ٥٧. المحصي | ژمێرەر |
| ٥٨.المبدىء | پەیداکار |
| ٥٩. المعيد | گێڕەرەوە |
| ٦٠. المحي | ژیێنەر |
| ٦١. المميت | مرێنەر |
| ٦٢. الحي | زیندوو |

| | |
|---|---|
| ٦٣. القيوم | ڕاوەستاو |
| ٦٤. الواجد | هەبوو |
| ٦٥.الماجد | خاوەن پایەیی بەرز |
| ٦٦. الواحد | یەك |
| ٦٧. الأحد | تاك، تەنیا |
| ٦٨.الصمد | جێی نیازو بیٚ نیاز |
| ٦٩.القادر | توانادار |
| ٧٠.المقتدر | خاوەن سەرچاوەی توانا |
| ٧١.المقدم | پێشخەر |
| ٧٢. المؤخر | دواخەر |
| ٧٣. الأول | یەکەمین |
| ٧٤. الآخر | دوایەمین |
| ٧٥. الظاهر | ئاشکرا |
| ٧٦. الباطن | شاراوە |
| ٧٧. الوالي | سەرپەرشتی کار |
| ٧٨. المتعال | زۆر بەرز |
| ٧٩. البر | چاکەکار |
| ٨٠. التواب | تۆبە وەرگر |
| ٨١. المنتقم | تۆڵەسێن |
| ٨٢. العفو | لێبوردە |
| ٨٣. الرؤوف | میهرەبان |
| ٨٤. مالك الملك | خاوەن موڵك |
| ٨٥. ذو الجلال ولأكرام | خاوەن پایەی بەرزو ڕێز |

| | |
|---|---|
| ٨٦. المقسط | داد پەروەر |
| ٨٧. الجامع | کۆکەرەوە |
| ٨٨. الغني. | دەوڵەمەند |
| ٨٩. المغني | دەوڵەمەند کار |
| ٩٠.المانع | بەرگر |
| ٩١. الضار | زیان گەیەن بە دوژمن |
| ٩٢.النافع | سود گەیەن بە خۆشەویستانی |
| ٩٣. النور | ڕووناکی |
| ٩٤. الهادي | ڕێپیشاندەر |
| ٩٥. البديع | داهێنەر |
| ٩٦.الباقي | هەرماو |
| ٩٧.الوارث | میرات گر |
| ٩٨. الرشيد | کارزان |
| ٩٩. الصبور | ئارامگر |

**تێبینی**

ناوی خوا (الله) –جل جلاله– لەڕیزی(٩٩) ناوەکان نەژمێردراوە، دەنا دەیکردە (١٠٠–)،کەواتە ئەو (٩٩) ناوە هەموو یان سفەتی خوا (الله) ن و وەسفی ئەویان پێکراوە مەبەست لە ڕستەی (من أحصاها دخل الجنة) لەبەرکردن و تێگەیشتن و بیرلێکردنەوەو کار پێکردنی ئەو ناوە بەرزو پیرۆزانەیە ، هەروەها خوای گەورە ناوو سیفەتی دیکەیشی هەن جگە لەم نەوەدو نۆ ناوەیە.

## ﴿هەندێك ڕێنمایی لەفەرمووده زێڕینەکانی پێغەمبەر ﷺو زانایان﴾

*نموونەی موسوڵمان وەك چی وایە ؟

–وەك دارخورما وایە بەردەوام ڕێك و ڕاست و پتەو و سەوزە و بەرهەمی شیرینە.

*باخەکانی بەهەشت لە دونیادا کوێیە ؟

–مزگەوتەکان پێویستە بەردەوام دڵمان پێوەی بێت .

*کێ لە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدا دەبێت ؟

–کەسێك هەر لە منالییەوە دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە .

*ئاوی بەهەشت چۆنە ؟

–لە هەنگوین شیرینترە ، لەئاو نەرمترە ، لە بەفر ساردترە ، لە شیرسپی ترە.

*بەچی پاداشتی حەج و عەمرەیەکمان دەست دەکەوێت ؟

–بە نەخەوتنەوە لە دوای نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵاتن ، لەو نێوانەدا قورئان و یادی خوای تیا بخوێنین پاشان دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکەین .

*بەچی پاداشتی حەجێکی تەواومان دەست دەکەوێت ؟

–سەیرکردنی دایك یان باوك بە خەندە و سۆزو خۆشەویستی یەوە .

بۆهەر سەیرکردنێك پاداشتەکە دەنووسرێت .

*دڵی موسڵمان پێویستە چۆن بێت ؟

–ئاوەدان بێت بە خۆشەویستی هەمووان دووربێت لە ڕق و کینە .

*پێویستە چیمان هەبێت لەماڵەوە ؟

–کتێبخانەیەکی تایبەت ، کتێب و نامیلکە و گۆڤاری منالانی تێدابێت .

*چۆن گەنجینەی بەهەشتمان دەست دەکەوێت ؟

-بە ووتنی ﴿ لا حَولَ و لا قوةَ إلاَ بِالله ﴾

*بۆ ئەوەی خاکەکەمان سەوز کەین پێویستە هەموو ساڵێك هەر یەکەمان چەند نەمامێك بچێنین .

*زانست لە مناڵیدا وەك نەخشی سەر بەرد وایە ، پێویستە هەر لە مناڵییەوە داهاتوومان بنەخشێنین .

*بۆ ئەوەی تەندروستیمان باش بێت (٤٥ ) دەقیقە پێش نان خواردنی بەیانیان ( ١- ٢ ) بەرداخ ئاو دەخۆین بە مەرجێك سارد نەبێت .

*پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت حەزم دەکرد سورەتی ( تبارك ) لە دڵی هەموو مرۆڤێکی ئومەتەکەم هەبوایە .

*پێویستە هەموو موسوڵمانێك ئەم نزایەی لەبەربێت ڕۆژانە چەند جارێك بیڵێتەوە. ﴿ یا ربي لَكَ الحمدُ كما ينبَغي لجلالِ وَجْهِكَ و عظيمِ سُلطانِكَ ﴾

واتە : ( ئەی پەروەردگارم هەرچی سوپاس و ستایشە شایستەی تۆیە و بەو شێوە گەورەو مەزنەی شایەنی شکۆمەندی ڕوویی تۆیە )

*جوانی باڵندە لە پەڕەکانیدایە ، هی مرۆڤیش لە زمانیدایە .

*با بەزمانمان فرمان بە چاکە بکەین و نەهی لە خراپە بکەین .

*ئەگەر جارێك کەوتی هیوا بڕاو مەبە چونکە سەرکەوتن بۆ هەموو کەسێکی کۆڵنەدەرە .

*هەرچی شتێکمان بۆ خۆمان پێ خۆشە پێویستە بۆ برا موسوڵمانەکەیشمان پێمان خۆش بێت .

*هەرکەسێك سوننەتێکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زیندووبکاتەوە بەر شەفاعەتی دەکەوێت لە ڕۆژی دواییدا .

*هیچ شتێك لەلای خوای گەورە قورستر نییە بۆ تەرازووی پێوەری باوەڕدار وەك ڕەوشتی بەرز .

*خوای گەورە ڕقی لە کەسێك دەبێتەوە کە خراپەکاربێت و زمان پیس بێت .

*پێویستە لە ڕێگای بیستنەوە پەروەردەیی ئیسلامی فێربین . وەك بەشداری لە کۆڕ و گوێگرتن لە وتاری تۆمارکراو و ڕادیۆ .

*ئەو بابەتانەی کە زۆر پێویستە بۆ نەوجەوانان بخوێنرێت .

–تەفسرێکی ئاسانی قورئان .

–چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

–پووختەی مێژووی هاوەڵانی پێغەمبەر و کەسایەتیە بەناوبانگەکانی ئیسلام کەوا کاریگەری گەورەیان هەبووە .

*لەکاتی پشووی قوتابخانەکاندا :

–بەشداری فێربوونی خولەکان دەبین ، وەك خولی فێربوونی قورئان و فەرموودە و لەبەرکردنیان و خولی کۆمپیوتەر و خەت خۆشی ...هتد

–تێکەڵی خەڵك دەبین و سوود لە چاکەکانیان وەردەگرین و هەڵەکانیان دووبارە ناکەینەوە .

–زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران لەبەردەکەین و ڕۆژانە دەیڵێین .

–لە کۆتاییدا باشترین خەڵك ئەوەیە زۆرترین سوودی بۆ خەڵك هەبێت .

# كۆتـایی

ئه‌مه‌ش كۆمه‌ڵێ ئاداب و ئاكاری ئیسلامی بوو كه‌ خوای گه‌وره‌ یارمه‌تی دام بینووسم به‌و هیوایه‌ی بتوانم سوودێك بگه‌یه‌نم به‌ نه‌وجه‌وانانی خۆشه‌ویست و خوێنه‌ره‌ به‌ڕێزه‌كان . تكاكارم خوای گه‌وره‌ لێمی وه‌رگرێت و بیكاته‌ ته‌رازووی كرده‌وه‌ چاكه‌كانمه‌وه‌ .

**تێبینی**: زۆربه‌ی ئه‌وخالانه‌ی باسكران به‌ڵگه‌ی شه‌رعی له‌ قورئان و سونه‌تدا له‌سه‌رن، به‌ڵام ئێمه‌ بۆیه‌ به‌ڵگه‌كانمان باس نه‌كرد له‌به‌رئه‌وه‌ی نه‌وجه‌وانان بتوانن خاڵه‌كان به‌ ئاسانی له‌به‌ر بكه‌ن و جێ به‌جێی بكه‌ن

**سۆران عباس**

**چه‌مچه‌ماڵ – ٢٠١٠**

وصلى الله على محمد النبي ، وعلى آله وصحبه وسلّم

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلاأنت أستغفرك و أتوب إليك

# سەرچاوەکان

١-منهاج الصالحين في الاداب الاسلامية ، محمد عبدالعاطي بحيري
٢-صحيح البخاري ، الامام شيخ الحافظ البخاري .
٣- مهارات في التربية النفسية ، عجلة بساط جمعة.
٤-آدابك ايها المسلم ، عبدالعليم عبدالرحمن السعدي .
٥-قەڵای موسڵمان ، حەمزە بەرزنجی .
٦- لەبەر کردنی قورئانی مەزن ، غەریب عزیز .
٧-ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت، عەلی باپیر.
٨- ڕێنمایی موسڵمانان ، بۆ ئادابە شەرعییەکان ، سەربەست جەباری .
٩-المأثورات ، حسن البنا .
١٠- پرۆگرامی پەروەردەیی منداڵان ،یەکێتی قوتابیانی موسڵمانی کورد .
١١- تەفسیری ئاسان، بورهان محمد امین.
١٢- گۆڤاری بڕیار .
١٣- منهاج الطفل المسلم / فهيم مصطفى .

## نـــــاوەڕۆك




**خوێنەری بەڕێز :**

ئەم کتێبەی بەر دەستت بە کورتی و پوختی ئادابە ئیسلامییەکانی لە خۆ گرتووە و هەوڵدراوە زۆربەی ئەو ئادابانەی کە مرۆڤ پێویستی پێیە بە کورتی و خاڵ بەندی باسکراون بەو ئومێدەی بە وردی بیان خوێنیتەوە و لەبەریان بکەیت و بە جوانترین شێوە جێ بە جێیان بکەی بۆ ئەوەی بەختەوەری هەردوو دونیا بین و ببینە نموونەیەکی جوان بۆ نیشاندانی ئیسلام، وە ئەم نوسراوە زنجیرەی سێیەمی پەروەردەی نەوجەوانانەو و زنجیرەی یەکەم چەند وانەیەک لە بیروباوەڕی ئیسلامی و زنجیرەی دووەمیش چل فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ پەندو ئامۆژگارییەکانی بە ئومێدی پەروەدەیەکی ڕاست و دروست بۆ لاوان و نەوجەوانانمان .

کتێبخانەی ئایندە
( ٠٧٧٠٥٠١٦٦٨٠ )

چاپەمەنی سیما - سلێمانی